# دەستخۆشییەک لە بری پێشەکی...

محەمەد هەریری، بە هەوایەکی تایبەت چیرۆک دەنووسێت، کە پڕە لە هەستیاریی و ئامانج و پەیامی تایبەت، زۆرینەی چیرۆکەکان یەک ڕووداوی سەرەکییان هەیە، کە لەسەر هێڵێکی ڕاست بەرەو پێشەوە دەڕۆن و دواتر یان بە کراوەیی جێدەهێڵدرێن یان کۆنکلوژنێکی کۆنکرێتییان هەیە، کە ئەمەش تایبەتمەندیی چیرۆکە، بە کورت و درێژیانەوە.

کارەکتەری چیرۆکەکان کەم و لە هەندێک باریشدا لە دووان تێناپەڕن، شوێنی چیرۆکەکان کوردستان یان ئەورووپان، دیدێکی ڕەخنەیی زاڵە بەسەر ئەو پاڵەوانانەدا کە هەریری خۆی بە ئەنقەست زەقیان دەکاتەوە و لەوە دەچێت کارەکتەری خوازراوی ئەو بن، بۆ نموونە لە چیرۆکەکانی: (بەزمی کوڕەکانی خەلیفە فەعۆ، گلییەکانی عابیدێک...، کوێرایی)یدا ئەم دیدە ڕەخنەییە لە سەر زاری پاڵەوانی چیرۆکەکان بە ئاشکرا دیارە.

بە نزیکەیی هەموو چیرۆکەکان لە لایەن حەکایەتخوان (ڕاوی)ـی هەمووشتزانەوە دەگێڕدرێنەوە، شوێنی ڕاوییەکە دیار نییە، واتە گۆشەنیگای شوێنی ڕاوییەکە بزرە و دەکرێت هەر کەسێک بێت، کە بێگومان ئەوەی هەریری بناسێت و دیدی ئەو بۆ ژیانی کولتووریی و ئایینی و کۆمەڵایەتی شارەزا بێت؛ دەزانێت کە ئەو ڕاوییە جگە لە دەنگی ئەو وەکوو چیرۆکنووسەکە کەسی دیکە نییە.

لە ڕووی هونەرییەوە، چیرۆکەکان سادەن، لە ڕووی: گێڕانەوە، پلەت، زەمەن و شوێنەوە، چونکە یەک کەس دەگێڕێتەوە و دواتر کارەکتەرەکان دەخاتە گفتوگۆ، گرێکانی سادەن و ئاڵۆزکاندنیان تێدا نییە، یەک زەمەن بە یەک هێڵ دەڕواتە پێشەوە و یەک شوێنیش هەیە کە ڕووداوەکەی تێدا ڕوو دەدات.

بابەتی چیرۆکەکانی هەریری، هەمەڕەنگ و هەنووکەیین، کارەکتەرەکانیان گیرۆدەی گۆڕینی شوێن و کولتوور و زەمەنن، ئایین و ڕەخنەی مێنتاڵیتی زاڵی ئاییندارەکانی ئەم سەردەمەمان فەزایەکی گەورەی لە چیرۆکەکانیدا داگیر کردووە، وردیی و زرنگییەکی زۆر لە هەڵبژاردنی بابەتەکاندا بەدی دەکرێت، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر شێوازی موعالەجەکردنی ئەدەبییانەی ئەو بابەتانەیە، کە کاکە محەممەد هەریری زۆر وریایانە و لێهاتووانە توانیویەتی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، لە ڕووی زەمەنییەوە، چیرۆکەکان لە کیمیاییبارانکردنی هەڵەبجە لە 1988/3/16 ەوە دەست پێدەکەن، هەندێکیان زۆر هەنووکەیین و بە دەردی دەڵێن (هەڵمیان لێ هەڵدەستێت)، هەندێک لە چیرۆکەکان ئاییندەیین، تەنانەت چیرۆکێکیان لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدات.

زمانی نووسین و ئاخاوتنی چیرۆکەکان تا بڵێی شیرین و سازگارن، بە تایبەتی کە بە شێوزای ئاخاوتنی هەولێرییانە نووسراون، ئێمە پێشتر ئەم ئەزموونەمان لە چیرۆک و ڕۆمانەکانی م. شێرزاد حەسەن-ەوە بینیوە و چەند نووسەر و

چیرۆکنووسێکی دیکەش دووبارەیان کردووەتەوە، حەریری-یش بە ئاوایەکی زۆر شیرین و تایبەت بەو شێوازە چیرۆکەکانی نووسیون؟

هەموو چیرۆکەکان دیالۆگئامێزن و زۆر بە کەمیی مۆنۆلۆگ و چوونەوە ناو خودیان تێدایە، واتە چیرۆکەکە یان دیالۆگە، یان گێڕانەوەیە لە لایەن ڕاوییەوە کە ئاگاداریی هەموو وردەکارییەکانی چیرۆک و کەسێتییەکانیەتی، ئەمەش یەکێکە لەو خاڵانەی وای کردووە چیرۆکەکان کەمڕەنگتر بن، چونکە هەتا کارەکتەر فرەتر و دیالۆگ و مۆنۆلۆگ و ڕووداوەکان زۆرتر و ستایلەکانی گێڕانەوە و ڕاوییەکان فرەتر بن، هێندە چیرۆکەکانیش بەچێژتر دەبن.

لە ناو کۆی چیرۆکەکاندا، من دووانیان زۆر پەسەند دەکەم، (بابە ناوێرم بچم میز بکەم و گەشتێک بۆ لای سپانج بۆب)، ئەم دوو چیرۆکە، دوو چیرۆکی تایبەت و هەژێنەرن، کەس ناتوانێت بڵێت ڕوویان نەداوە، ئەو دوو چیرۆکە، دوو ئازاری نەبڕاوەی مێژووی کۆمەڵگەی ئێمەن: کوشتن و سەفەر، پاڵەوانی یەکەمیان کچۆڵەیەکە و هی دووەمیان منداڵێکە، هەردووکیان بوونەتە قوربانیی و لەپاڵیشیاندا خێزانەکەیان بوونەتە قوربانی، بە تایبەتی کۆتایی هەردوو چیرۆکەکەش منی زۆر کەمەندکێش کرد، کە بە کراوەیی جێهێڵدراون، ئەوە زرنگیی و وریایی نووسەر لە نووسینی چیرۆکەکانیدا پێشان دەدات.

نازانم تا چەند خوێنەری ئەدەبییاتە، بەڵام لاوازییەکی کەم بە چیرۆکەکانەوە دیارە لە ڕووی تەکنیک و هونەرەکانی دیکەی چیرۆکنووسییەوە، بەڵام هەریری، بە لێهاتوویی و هەستیاریی مرۆییانەی بەرانبەر کارەکتەرە ستەملێکراو و پەراوێزخراوەکان و شەڕ لە دژی دەمارگیریی و گەمژەیی توانیویەتی ئەو لاوازییە بشارێتەوە، واتە بەهێزی بابەتەکان و چیرۆکەکە و گێڕانەوەیان توانیویەتی ئەو لاوازییە داپۆشێت، دڵنیام ئەگەر هەریری چەند ساڵێک بە خەستی ئەدەبیات و ستایلە جیاوازەکانی چیرۆکنووسین و هونەری گێڕانەوە بخوێنێتەوە، چیرۆکنووسێکی بەهرەمەند و نازداری لێ دەردەچێت.

هیوای قوڵبوونەوەی زۆرتر و سەرقاڵبوونێکی فرەتر بەم بوارەوە لە برای ئازیزم دەخوازم، دەشخوازم ئەم پێشەکییەی من تەنیا وەکو دەستخۆشییەک وەربگرن بۆ ئەو هەموو جوانیی و غەم و وردەکارییانەی لەم چەند چیرۆکەدا هەن، بە هیوای گەشتێکی بەچێژ و هەژێنەر لەگەڵ ئەم چیرۆکە قەشەنگانەدا.

یاسین ئافتاو

2017/7/6

سلێمانی

# پێشەکی نووسەر

چیرۆکی من لەگەڵ نووسینی کورتە چیرۆکدا زۆر کۆنە، لە بیرمە لە ساڵانی هەشتاکانەوە چیرۆکم بۆ خۆم و هاوڕێکانم دەنووسی، بەبێ ئەوەی هەوڵی بڵاوکردنەوەیان بدەم، چونکە دەمزانی ناوەڕۆکی چیرۆکەکان زۆر لەوە مەترسیدارترن تا بڵاوبکرێنەوە.

ئەو ڕۆژگارە ئێمەی نووسەرانی لاو لەو زانکۆیانە تا بڵێی بەدبەخت بووین، هیچ هۆکارێك نەبوو ڕای خۆمان تیایدا بە راشکاوی دەرببڕین، نە ڕۆژنامەیەکی ئازاد، نە ئینتەرنێت و نە فەیسبوك ونە هیچ! ترس و تۆقاندن هەموو جومگەکانی ژیانی تەنیبوو.

لە بیرمە ئەو چیرۆکانە زیاتر دەستاودەستیان دەکردن لەبازنەی ئەو برادەرە کوڕ وکچانەی کە متمانەم پێیان هەبوو، جارووبار ئەوانیش بێ مۆڵەت وەرگرتن دەیانگەیاندە دەستی چەندین کەسیتری جێی متمانەی خۆیان.

زۆربەی نووسین و وەرگێڕانەکانمان بەو شێوەیە بڵاودەکردەوە، هەتا بەو دووابیە هاوڕێیەکی زانکۆی سەڵاحەدینم ناسی، کە لە قۆناغەکانی دوای منیش بوو، پێی گووتم کاک محەمەد من بێ ئەوەی بتناسم هەموو چیرۆك و نووسینەکانی سەردەمی زانکۆتم بەدەست دەگەیشت و بە تامەزرۆییەوە دەشمخوێندنەوە!

چیرۆکەکانی ئەو سەردەمەم زۆر گرنگ بوون چونکە لەناو جەوێکی ترسناك و تۆقێنەری بەعس لەدایك ببوون، زۆربەیان لەسەر بابەتی ئازادی و جەوروستەمی بەعس لە کورد، و شەڕەکانی براکوژی شاخ و جاشەکانی کورد، وکارەساتی ئەنفال و هەڵەبجە، و سووککردنی مرۆڤی کورد بوون! بەداخەوە لەگەڵ دەرچوونم بۆ دەرەوەی وڵات زۆربەی چیرۆکەکانم بێ سۆراغ کەوتن، هەندێ لە ناونیشانی ئەو چیرۆکانەی کە لەیادمن:

نانی هەورامی، خەوێکی قەدەغە، حەزی سەربانی، کۆمەڵەی مافی کتێب، ئەڤینی تیان ئان مین، پیشەسازی شەهید وچەندین چیرۆکیتر کە ناوەکانیانم لەبیر نین...

خەوێکی قەدەغەم بە عەرەبیش نووسیبوو دەمدایە دەستی هەندێ برادەری عەرەبی شیعە کە متمانەم پێ هەبوون، ئەو چیرۆکە لەلای منەوە بیرۆکەکەی نووسرا بە کوردی و عەرەبی لە ماوەی ساڵێکدا بەهەموو عێراقدا بڵاوبوەوە وەك واقیعێك ڕووی دابێت!

باسی خەونی کارمەندێك دەکات بە ڕووخانی سەدام، کە بۆ هاوڕێیەکی دەگێڕێتەوە، ئەویش ڕیپۆرتی دەکات لای دەزگای ئەمنی عێراق، کابرا دەگرن تاوانباری دەکەن بەوەی کە دژی سەرۆکی فەرماندە و حزبی قائیدە!

لەوانەیە زۆرتان گوێتان لێ بووبێتەوە، بەخوا من بێ ئەوەی لەکەسم گوێ لێ بێت، ئەو بیرۆکەیەم بۆ هات و نووسیم،

دوایی له‌ عێراق بڵاوبوه‌وه‌ که‌ به‌ڕاستی ڕوویداوه‌، به‌س من هه‌ر گومانم هه‌بوو که‌ سه‌رچاوه‌ی هه‌واڵه‌که‌ چیرۆکه‌که‌ی منه‌، دوور نییه‌ له‌ ڕێگای قوتابیه‌ عه‌ره‌به‌کانی شیعه‌ بڵاوبووبێته‌وه‌!

له‌ بیرمه‌ چیرۆکی پیشه‌سازی شه‌هید له‌ سه‌ره‌تای ڕاپه‌ڕینی ١٩٩١ نووسیبوو به‌ عه‌ره‌بی له‌ سه‌ردانێکم بۆ دهۆك، چیرۆکه‌که‌ باسی ئه‌و حزبه‌ کوردیانه‌ی خۆمانی ده‌کرد که‌ چۆن خۆیان به‌ ژماره‌ی شه‌هیده‌کانیان هه‌ڵده‌کێشن، بۆیه‌ سه‌رکرده‌ی حزبۆکه‌یه‌ک له‌ پێناو دروستکردنی شه‌هید بۆ حزبه‌که‌ی کۆمه‌ڵێك پێشمه‌رگه‌ ده‌نێرێته‌ کرده‌یه‌کی سه‌ربازی، له‌ دواوه‌ش بۆ دۆژمنیان ئاشکرا ده‌کات، تا هیچیان به‌ ساغی نه‌یه‌نه‌وه‌ و ئه‌ویش بتوانێت له‌ کاتی وتارداندا ستایشی خۆیی و حزبه‌که‌ی بکات به‌ ژماردنی شه‌هیده‌کانی!

له‌گه‌ڕانه‌وه‌م له‌ دهۆك به‌ ڕێگای موسڵ گه‌رامه‌وه‌ له‌به‌ر هه‌رزانی و ڕێگا ئاسانی له‌ خاڵی کۆنتڕۆڵی دهۆك- موسڵ دایانبه‌زاندین منیان پشکنی ئه‌و چیرۆکه‌یان دۆزیه‌وه‌ [صناعة شهداء]! باش بوو به‌ عه‌ره‌بی نووسیبوم ده‌نا تا ڕزگارم ده‌بوو ده‌رده‌سه‌ریه‌کی زۆر ده‌دیت. کابرای ئه‌منه‌که‌ چیرۆکه‌که‌ی خوێنده‌وه‌ و ده‌یگووت تۆ موخه‌ریبی ئه‌وه‌تا پیلانت داناوه‌ هێرش بکه‌نه‌ سه‌ر سه‌ربازگه‌ی حوکمه‌ت، چونکه‌ له‌ چیرۆکه‌که‌ وا هاتبوو!

منیش گووتم ئه‌وه‌ چیرۆکه‌ ڕه‌خنه‌یه‌ له‌ حزبه‌ کوردیه‌کان، به‌ ته‌مام ئه‌و چیرۆکه‌ بنێرمه‌ گۆڤارێکی عێراقی بۆ

بڵاوكردنەوەی! باش بوو یەكێكی تر هات كەمێك مرۆڤێكی تێگەیشتوو و خوێندەوار بوو، كە چیرۆكەكەی خوێندەوە گووتی ڕاستە ئەوە ڕەخنەیە لە ئەحزابی بەكرێگیراوی عەمیلەی كوردی، بەڵام حوكمەتیشت بە دوژمن داناوە! گووتم من لە ڕوانگەی ئەوانەوە نووسیومە دەنا چۆن دەوێرم لە گیرفانم بێت وبێرە تێپەڕم، یان بینێرم بۆ بڵاوكراوەیەكی عێراقی؟!

پاش پێنج سەعات ڕاگرتن گووتی ئەوەش ڕاستە من تێت دەگەم ئەو جارە بڕۆ، جارێكیتر ئاگادار بە، من لێرە نەبام ئەو نەخوێندەوارانە كەوڵیان دەكردی!

ئەو كۆمەڵە چیرۆكە هەندێكیان ڕەگیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە وەك بیرۆكە لە خەیاڵم بوون، بەو دواییانە نووسیمن وەك چیرۆكی سەگەكەی یوئێن، كراس سوری گوڵ گوڵی هەر لە پاش كارەساتی هەڵەبجە لە خەیاڵمدا نووسیم!

من هێشتا خۆم وەك چیرۆک نووس ناناسێنم، بەڵام لە ناخمدا هەستدەكەم لە چیرۆك نووسیەوە نزیكترم تا توێژەر، ئیتر ئەوە چەند هەوڵە جیرۆكێكە، هەرچەندە لای برای بەڕێزم كاك یاسین ئافتاو چیرۆكن پڕ بەواتای وشە، سەرەڕای هەندێ سەرنجیشی، هیوادارم لە كەموكوڕیەكانی بمبەخشن.

محەمەد هەریری / لەندەن

٢٠١٧/٧/٧

# کراس سوری کوڵ کوڵی!

زۆریان لێکردی تا لەگەڵیان بچیتەوە بۆ هەڵەبجە، بەڵام خۆزگە نەچووبایت.. خۆزگە لەو ڕۆژە تووشی بەڵایەك یا نەخۆشیەك دەبوویت بەڵکو قەت دوچاری ئەو ڕۆژگارە نەدەبوویت.

دەمێك بوو هاوڕێیانی کۆلێژەکەت لە هەڵەبجەییەکان پەیوەندیەکی زۆر خۆش و نزیکیان لەگەڵتدا هەبوو، کەم ڕۆژ هەبوو لە پاش تەواوبوونی زانکۆ نەچیتە لایان لەو کۆنە فلاتەی لای تەعجیلی هەولێر. ئەوانیش هێندە بەڕێز و خۆشەویستی و نەرمیەوە مامەڵەیان دەکردیت دەڵێی تۆ میوانی ئەوان بوویت لە شارەکەی خۆت! تۆش دەم نادەم بە زۆر پەلکێشت دەکردن بۆ ماڵەوە، بەڵام ئەوان بەوە مورتاح تر بوون تۆ بە تاقی تەنها بچیتە لایان، نەك ئەوان بە دە کەسەوە بێنە ماڵەکەی تۆ!

لەوە دەچێت هەستیان بە هەژاری و کەمدەرامەتی ماڵی ئێوە کردبێت، بۆیە وا بە زۆر دەهاتن، ئەگینا بیرمە باوکم و دایکم و خوشک و براکانم لەوپەڕی ڕیز و ڕووخۆشیەوە پێشوازیان لێ دەکردن، هەتا باوکی ڕەحمەتیم بەو ڕوحیەتە پاک و سادەی خۆیەوە تا دەڕۆیشتن هەر نوکتەی خۆشی بۆ دەکردن! ئەو هەستەم پی ناخۆش بوو لەبەر دەستکورتی ئێمە نەیەن بۆ ماڵەوەمان. دایکم و خوشکی گەورەم ڕاستیەکەی کە دەهاتن

زۆر هەستیان بە ئیحراج و کەمتەرخەمی دەکرد، نەوەك نەتوانین وەك پێویست خزمەتیان کەین..

دواجار کە قەول بوو دەعوەتیان کەیت، ماڵەکەتان هیچی تێدا نەبوو، بۆ ئەوەی ئەو خەم و ئیحراج بوونە لەسەر دڵی ماڵەوە بە تایبەتی دایکت و خوشکت هەڵگریت، ناچار بوویت یەك فەردە لە کتێبە هەڵبژاردەکانت بفرۆشێت تا دەعوەتێکی لایقیان بۆ بکەیت!

ئەو هەڵەبجەییانە هێندە هەستیار بوون، کە هاتن بۆ دەعوەتەکە و هەستیان کرد زۆرمان لە خۆمان کردوە تا خواردنێکی باشیان بۆ ئامادە کەین، بە پێچەوانەی ڕادیتنت بە حاڵ دەستیان بۆ خواردنەکە برد سەرەڕای ئەو هەموو فشار و فەرموو و سوێند خواردنەی بۆ ئەوەی زیاتر بخۆن! ئەمن دەڵێم ئەو هەستە زۆر دەگمەنە مەگەر بەس لای هەڵەبجەییەکان دەست کەوێت...

ئەوان زۆر حەزیان بە قسەکردنی تۆ بوو، نەك لەبەر ئەوەی وەک کرمی کتێب بوویت وبەردەوام لە خوێندنەوەدا بوویت، بەڵکو کە باسەکانت بۆ دەکردن بە زاری هەولێری زۆریان پی خۆش بوو پاش چەند مانگێك لە هاموشۆیان هەوڵیان دەدا وەک تۆ بە هەولیری بدوێن، بەڵام ئەوجارە تۆ پێکەنین و خۆشت دەهات لە قسەکردنی هەولیری ئەوان!

ڕۆژگارێکی سەخت بوو بەعس هەتا هەناسەکانی خەڵکی دەژمارد، ڕۆژێک عەرەبێکی بەغدایی بەعسی کە ناوی

شەیبان بوو هاتە لات لە کافیتێریای کۆلێژەکە بە چایەکەوە تەنها بۆ ەوەی پێت بڵێت کە ئاگادارن تۆ سەردانی فلاتێکی زۆری قوتابیانی زانکۆ دەکەیت. گووتی بۆ هێندە دەچیتە لایان، تۆش گووتت ماڵەکەمان بچوکە و شوێنی خوێندنم دەست ناکەوێت لای ئەوان دەخوێنم لەگەل هاوپۆلەکانم!

هەتا تۆ پێشی کەوتیتەوە ودەعوەتت کرد ئەگەر حەزی لێیە، بەڵام ڕەتی کردەوە!

بەر لە پشووی نیوە ساڵ سەریان خستە سەر سەرت ئیلا و بیلا دەبێت لەگەڵمان بێیت بۆ هەڵەبجە، کاروانیان لە هەموویان سوورتر بوو هەر زوو سوێندیشی خوارد کە پارەی هەردوو سەریش لەسەر منە! دەتگووت دەیانزانی ئاسان نییە پارەی کرێی هەردوو سەرت دەست کەوێت، هەر زوو ئەو خەمەیان لە کۆڵە تۆ کردەوە، هەرچەندە ئەوەش ئازاری دەدایت بارگرانیت بکەوێتە سەر ئەوان، چونکە خۆشیان کەم دەرامەت و دەستکورت دیاربوون. بەڵام ئەوەی کەمێك ویژدانت ئاسوودە دەکات ئەوەیە تۆ زۆرت کرد تا نەچیت، و بەردەوام لەو بیرۆکەیە ڕات دەکرد تا ئەو ئێوارەیە پاش خواردنی برنج و قاچی مریشک، کوپە چایەکانیان هێنا و ڕادیۆکەش لەسەر گۆرانیەکی نەرمی عەلی مەردان بوو، دەتگووت تەڵەیان بۆ دانابوویتەوە هەموو ڕێگایەکیان لێگرتی تا داواکەیان ڕەت نەکەیەوە و گووتیان ئیلا و بیلا هەر دێت لەگەڵمان کاك ڕەشیدیان گووتی لە مزگەوتی خانەقا بە خزمەت باوکت گەیشتم لە نوێژی عەسر و دەستیم ماچ کرد، و داوای ئیزنم

لێکرد لە گەڵ خۆمان بتبەینەوە ئەویش ڕازیبوو! هەرچەندە تۆ لەوە دەرچوو بویت مۆڵەت بۆ شتی وا وەرگریت، بەڵام لە کۆتاییدا کۆڵت دا بۆ داواکەیان، بەڵام لە دڵەوە زۆریشت پێ خۆشبوو هەڵەبجە و ناوچەکە ببینیت، و وەعدی ئەوەیان پیدایت بتبەن بۆ هەوارامان و هەموو شار وشارۆچکەکانی ناوچەکە.

دوا ڕۆژی دەوام چوینە  نەقلیاتەکە قوتابیانی سلێمانی و هەڵەبجە و سەید سادق و کەرکوک و زۆر شوێنیتر لەو نەقلیاتە بوون. کە کۆستەرەکە دەرگای کردەوە بە یەك سات پڕی بوو لە کوڕان و کچانی زانکۆ. لە بیرتە کە کەوتیە تەك کچێکی شۆخی سلێمانی کە دوو ساڵ بوو لە چەندین وانەی هاوبەشدا بەژدار دەبوون کەچی چاک و چۆنیشتان نەبوو، پێت سەیر بوو هەر زوو بەناوی خۆت چاک وچۆنی لێکردیت، تۆش بە شەرمە لەرزەیەکەوە  وەڵامت دایەوە، هەر زوو چویەوە ناو قاوغی خۆت وەك کیسەڵ، وەک گوێچکە ماسی، وەك بێچووی کەنگارۆ! زۆری نەبرد داوای لیکردیت گۆڤارەکەی الف باء ی بدەیتێ تۆش هەر زوو داتە دەستی، زۆری تری نەبرد کە گۆڤارەکەی دایەوە دەستت گووتی: دەزانی کچان لە نێوان خۆیان ناویان لێناویت بە کتێبخانەی گەڕۆك! گوتت بۆ، گووتی چونکە هەردەم دوو سێ کتێبت پێیە یان سەرت بەسەر کتێبێك داگرتووە! لە شەرمان هەموو جەستەت دەلەرزی، ئەو شەوبۆیەی کە هەموو کوڕانی کۆلێژەکە بە هیوای بزەیەکی ئەو بوون، بەو جورئەتەوە قسەت لەگەڵ دەکات! چەند هەژارن گەنجی وڵات هەتا نازانن چۆن

هەڵس وکەوت بکەن لەگەڵ ڕەگەزی تردا! درۆ مەکە تۆش ئەو کچە سەرنجی ڕاکێشایت، خەونیکی پەنهانی تۆش بووە، بەڵام حەزت لە هیچ شتێك نییە کە قەرەباڵغی لەسەر بێت! ئەو کچە چاوێکی زۆری لەسەر بوو لە کورد و عەرەبیش! ڕۆژانە دەیان کەس داوای پەیوەندیان لێدەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ هەتا چاك وچۆنیشت نەبوو لەگەڵی جیابویی لەوانەی دوای دەکەوتن و بەزۆر یەخەیان دەگرت و ڕێیان پێ دەبڕی، ئەو ڕیزێکی تایبەتی هەبوو بۆت! هاوڕییانی هەڵەبجە بە چاو و بزە ئاماژەیان بۆ دەکردم کە خۆشبەختی! هەستم دەکرد سەربازە چەتێنراوەکانی بازگەکان لەبەر خاتری ئەو کچە ڕێگایان پیدەگرتین و دەیانهێنایتە خوارەوە تا تێر بن لە تەماشاکردنی!

باسی زۆر شتتان کرد، ئەوەی تێگەیشتی لەو کچە ئەوەیە کە ئەو لە ژێر فشارێکی گەورەیە لەلایەن دەسەڵاتدارانی بەعس تا ڕادەی هەڕەشەکردن لە گیانی! تۆش خۆت لە ژێر چاودێری دەسەڵاتیت، بەردەوام جاڕست دەکەن نەتدەزانی چی وەڵامی ئەو کچە بدەیتەوە!

بەعس کەشێکی بێ متمانەیی وای دروست کردبوو، ترسی ئەوەت هەبوو هەرچیەك بڵێیت بگاتەوە ئەوان، بەڵام هەر غیرەتت قبوڵی نەکرد پێیت گووت: تۆ خوشکی ئێمەی ئەگەر کار بەوە گەیشت وازت لی نەهێنن، بەڕای من کۆلێژ بەجێ بهێڵیت بە کەرامەتتەوە باشترە لەوەی سەردانوێنی بۆ هەڕەشەی ئەوان! پێیم گووت ناوەکانیشمان بدەرێ من

دەیگەیەنم بە لایەنێك بۆ سزادانیان. ئاخیر قسەی ئەو ئەوەبوو کە ئەویش پێی خۆشە بە دڵی خۆی پەیوەندیەکی پاکی هەبێت لەگەڵ کوڕە کوردێك، بەڵام دەترسێت سەبارەت بەو شتێکی لێبکەن! هەتا خۆشەویستیش باجی هەبوو لە زەمەنی بەعسدا!

گەیشتینە سلیمانی، و لە نەقلیاتی ئەوێش بۆ هەڵەبجە سواری کۆستەرێکی تر بووین، هەر لەناو کۆستەرەکە هاوڕێیانم کەوتنە جاک وچۆنیەکی گەرم لەگەڵ پیاوێکی نزیك پەنجاساڵی ومنیان پێ ناساند، و بەمنیشیان گووت، کە مامۆستا حەمە غەریب ڕۆشنبیرێکی شارەکەمانە، کاکە یەخەی گرتین ئیلا و بیلا لەگەڵی دەچینەوەماڵەوە، ئەوە بوو من و سێ هاوڕێی هەڵەبجەیی  بە مەرجی ئەوەی تەنها بۆ چا خواردنەوە لەگەڵی دەچین، چووین، لە ناکاو پەریەکی کراس سوری گوڵ گوڵی بەخێرهاتنی کردین و نیگامان یەکانگیر بوو، نازانم ئەو هێزە تەلیسماویە چ بوو ناخمی هەژاند! سینیە چایەکی هێناو و باوکی لێی وەرگرت..من پەشیمان نەبوومەوە کە چووینە ماڵی حەمە غەریب، و یەکسەر زیاتر بۆی کرامەوە کەوتینە ناو باس وخوازی سیاسەت و فیکر و دین! خۆشبەختانە بیرورامان زۆر لە یەك نزیک بوو، زۆر سەرسامی بە باسەکانی مندا دەردەبڕی، بۆیە لە دڵی خۆم گوتم دەبێت تا لێرەم کارێك بکەم هەواڵیک بۆ کچە کراس سورە گوڵ گوڵیەکە بنێرم، چاوەڕوانیم بکات تا کۆلێژ تەواو دەکەم!

کاک کەمال وەعدی پێدام لە ڕێگای خێزانی خۆی هەواڵی منی پێ دەگەیەنێت! هەواڵم بۆ هاتەوە کە ڕازی بووە! بەڵام ڕازیش

بێت جم لە دەست دێت؟! گەنجێکی قوتابی بێ پارە و بێ کار و لە خێزانیکی نەدار، هەتا تەخەروجیشت کردبیت چۆن دەچیتە خوازبێنی؟! دوایی گوتت خوا کەریمە جارێ با زانکۆ تەواو کەین!

ڕۆژێك چوویتە فلاتەکەی هەڵەبجەیەکان، دیتت خەم و نیگەرانی دایگرتبوون، گوتیان هەڵەبجە کیمیا باران کراوە، هەموویان دەگریان تۆش لەگەڵ ئەوان دەگریایت، ئێوارە جوویتە ماڵی خزمێکت باسی ئەو هێرشەی هەڵەبجەی کرد، سەیرت پیهات چۆنی زانیوە، گووتی من ڤیدیۆکەشیم دیتوە، گووتت باشە جۆن وێنە و ڤیدیۆیەکت دیتوە، گووتی پێت دەڵێم بەڵام مەیدرکێنە، من ئاریەلی تەلەفزیۆنێك بەهێز کردوە ئێرانیش دەکێشێت بابچیین سەیری کەین!

چوینە ژورەکە سەیرت پێهات خۆ راستە ئەوە تەلەفزیۆنی ئێرانە، بوە هەواڵەکان و پۆل پۆل وێنەی شەهیدبووانی هەڵەبجەی نیشان دەدا، لەناو پۆلێکدا حەمە غەریبی نووسەرم ناسیەوە، چەند هەنگاوێک لە دوور ئەوەوە کچێکی کراس سوری گوڵ گوڵی کەوتبوو.

محەمەد هەریری

لەندەن

٢٠١٦/٣/٢١

# دواهەمین داوای شەیتان لە خوادا!

ئەمنیش خەونی قۆڕ دەبینم ها! هەندەکیان ناوێرم بشگێڕمەوە، جارێکیان کە ڕێکخراوی نهێنی بووم لە شار، ئەمن و موخابەرات لە خەونمدا دوام کەوتبوون، سەرم بە هەر کونێك دەکرد خەڵکەکە بانگی ئەمنەکانیان لێدەکردم! تا گیرام و کاتێ هێنامیان بۆ ئیعدام، منیك کە لەسەر کوردایەتی گیرابووم، خەڵکی شار ئاهەنگیان دەگێڕا لە خۆشی لە سێدارەدانی من، و زمانیان لێ دەردەهێنام و گاڵتەیان پیدەکردم! خەونی ئەوجارەم نازانم بڵێم قۆڕ بوو یان قۆڕتر لەوانی پێشوو! خەونەکەم زۆر سەیر بوو، لەوانەیە باسی کەم زۆر کەسیش باوەڕ نەکەن! باشە بۆ باوەڕ بە کەسانێك دەکەن هەمووژیانی سەروەری خۆی بە خەون دەباتە ڕێوە، ئەگەر ئەوان خەون بە پیاسە کردن لەگەڵ خوا ببینن و وەك چوارپایەکەی جەمشید بە ئاسماندا سوڕابنەوە لەگەڵ خوا، بۆ دەبێت خەونەکەی من ڕاست نەبێت؟؟!

ئەو ئامانجی سیاسی زۆر ئاشکرا دیارە بە خەونەکانی لایەنگیران ودۆستانی سەرسامتر دەکات، کاریزمای خۆی زیاتر دەکات، نابینن پاش ئەو خەونانە هەست دەکات پایەی ئێستای زۆر بجوکترە لە قەبارەی، دەیەوێت کاندید بکرێت بۆ بەرزترین پۆستی وڵات! من لەو خەونە نەك هیچم دەست ناکەوێت، دوور نیە تووشی سەر ئێشەمیش کات، بەڵام سەرم بۆ سەرئێشاندن دەخورێت لیی ڕاهاتووم!

ئەو شەو لە خەونمدا ڕۆژی قیامەت بوو ئەو هەموو ملیار مرۆڤە لە دادگای مەحشەر وەستا بوون [خوا پەنامان دا] لە دەستی ڕاستی خوا کۆمەڵێک خەڵکی نورانی و ڕووگەش وەستابوون، دەتگۆت مانگن!

لە دەستی چەپیش دێورزمەیەکی ڕەشتاڵەی دزێوی ترسناك وەستابوو لەگەڵ هەزارانی هاوشێوەی خۆی بەڵام کورتە باڵاتر وکەمێك دزێوتر لە خۆی لە پشتیەوە وەستا بوون.

خەڵکەکەش هەمووی ڕووت و قووت وەك قەرەباڵغیەکەی حەجێ، بەڵام بە ڕووتی و قووتی، بێ ئەوەی کەس تەماشای کەس بکات، لەبەر ترسناکی هەڵوێستەکە! کابرایەکم دیت ئارەقەی هەتا سینگی هاتبوو گۆتم: ئەمە چینە لێرە دۆزەخیین؟!

-گووتی: نا جارێ دادگایی نەکراوین!

-باشە ئەدی ئەو هەموو ئەشکەنجەیە و چاوەڕوانیە و ئارەقەکردن هەتا نێوچەوانمان چیە ئەگەر دۆزەخ نەبێت؟!

-کورە کاکە تۆ دیارە لە دنیا بە نەستەلە بەخێوکراوی، چت دیتیە، ئەوەی ئەمەی تێیداین بەهەشتە لەچاو دۆزەخیە هەژارەکان کە لەناو ئاگرەوە چاوەڕوانن!

-پەکوو چا نەبوو لەگەڵ ئەو مەلعونانە نەبووین!

-هەر تەماشەیەکی دەوروبەری خۆت کە، ئەو هەموو دەمووچاوە نورانیانە کە دەبینیت، دەزانیت ئینشاڵلا بە هەشتین!

پاش چاوێك گێڕان بە دەوروبەری کۆمەڵێکی ناسیەوە و گووتی:

-وەڵا باوەڕناکەم ئەمەلە جیی ڕاست وەستا بین! ئەتوو دڵنیایت ئێرە جێگای بەهەشتیەکانە یان ئەوانەی هیوایەکی زۆر هەیە بچنە بەهەشت؟!

-بۆ خێرە وا لێت شێواوە، جارێ ئارەقە نەگەیشتۆتە ناوکت!

-کورە ئەو ناوە پڕی ئینتیحاری دووگمە بە دەستن، دیارە بە دوگمەوە ناشتوویانن تا ببێتە بەڵگە لەسەر گەورەیی کارەکانیان، ئەوانەم کە کاتی خۆی لە دنیای بێ وەفا لە یوتیوبی هەموویانم دییوە! ئەوە ابو حذیفةی عەنزی سعودیە، ئەوە خلیل سوریە، ئەوە فاروق جەزائیریە، ئەوە حەمزە شیشانی، و سوهەیب سۆماڵی و ابو قتادەی کوردستانی، لە پێشەوەی ئەوان بن لادن و زەرقاوی و زەوابری و بەغدادی وجۆلانی، و لە هەمووی سەیرتر ئەوەش ئەو کابرایەیە شیکۆ حەڕام، کە خەڵکی هەمووی لای ئەو [ئەرنانێ] یە!

-مەبەستت ابوبکر شیکاوە، بەڵام ئەرنانێ چییە؟!

-ناکا نەزانی؟! خۆ کەس نەمایە لە یوتیوبی ئەو ڤیدیۆیەی نەدیتبێت! یانی کافر!

-کورە یوتیوبی چی، من هەر خەریکی عیبادەت بووم، چما وەختی ئەو شتانەم هەبوو!

-ئەدی لۆ ئارەقەی ڕەش وشینت هەتا نیوچەوانی هاتیە لە ترسان تۆقیوی، دیارە متمانەت بەخۆت نییە؟! بزانە چت كردیە!

-خوا بەخۆی دەزانی ئەوە دادگایی شەیتانیە با گوێ بدەینێ بزانین خوا چۆن ڕیسوای دەكات!

-كامە شەیتانە؟!

-ئەدی ئەو شینە مەلعونەی نابینی لە دەستە چەپی عەرشی ﷻ؟

-بابا لەگەڵ بەچكەكانی!

-ئەوانە شوێنكەوتەی ئەون لە ئینس وجن!

دەنگێكی بەرز و ڕوون وخۆش دەهات كە گفتوگۆی لەگەڵ شەیتان دەكرد وگووتی:

-ئەوە كردەوەكانتمان هەمووی بۆ نیشاندای بە بەڵگە و وێنە، دەزانیت چ كارەساتێكت كردوە بەو داماوانە، بە ملیۆنەهات لە خشتەبردوە، تاوان و شیركت پییانكردوە! ئێستا كاتی ئەوە هاتووە هەقی خۆت وەرگریت وبۆ هەتا هەتایی لەو دۆزەخەی كە دەیبینیت بسوتێنرییت!

-بەس خودایە خەتای من نەبوو بە تەنیا، من تەنها پستەم دەکرد لە دڵ و بناگوییان یەکسەر بەدووم دەکەوتن و بە قسەیان دەکردم، لەو عینسانەی خوێڕیترم نەدیتیە!

-دەزانم ئەوانیش نابینی وەکی توو شێوەیان بوویتە شەیتان و چاوەڕێی دۆزەخن!

-بەڵام خوایە تۆ بۆ ئەو هیزەت دا بە من و بۆ ئەو هەموو لاوازی و خوێڕیاتی و بەتاڵیەت دایە مرۆڤ؟!

-ئەوجا مەبەستت چیە؟ بۆ نایەت فێری ئیشی خۆم کەیت؟!

-استغفرالله نا بەس پرسیار بوو!

-نازانی پرسیار لە خوا ناکرێت چ کاری کردوە، ئێوە پرسیارتان لێ دەکرێت! هەر ئەو سەرکێشیەت بوو و ئەو فزوڵیەتەت بوو کاتی خۆشی لە بەندەیەکی موقەرەب و نزیک خۆمەوە، بویتە ئەو شەیتانەی کە شەو و رۆژ موسڵمانان نەفرەتیان لێدەکردیت!

-نەفرەتی تۆ بەسەرچاوم، بەس ئەو ئادەمیە خوێڕیانەی کە زیاتر نەفرەتیان لێدەکردم، لەمن خوێڕیتر و شەیتانتر بوون، بەو نەفرەتانەیان لاوازی وخوێڕیاتی خۆیانیان دەشاردەوە بۆ چەواشەکردنی خوێڕیە عەوامەکان! بەڵام لەبەر میزەری سپی و ڕەشی گەورە و کەواو سەڵتەی پان وبەرین، خەلك ڕیزی لیدەگرتن!

-هەمویان هەقی خۆیان وەردەگرن ئەگەر وایان کردبیت!

دوا پرسیار و داواکاریت چیە پێمبڵێ، بەرلەوەی بۆ هەتا هەتایی بچیتە ئەو دۆزەخەوە کە بە تایبەت بۆ تۆم داناوە!

-خودای گەورە زۆر سوپاست دەکەم ئەگەر کاری شەیتانیم بۆ درێژکەیەوە!

-بەس ئەوە دنیا تەواو بوو، شەیتانیەتی بەسەر کێ دەکەیت؟ !

-بەسەر جیهانێکیتر، ئەستێرەکیتر ماقوڵە ئەو هەموو ترلیۆنە هەسارە و ئەستێرانەت دروست کردبیت لەبەر چاوی کاڵی ئینسان!؟ یەکێك لە جەماعەتی دەستەڕاست لە نورانیەکان گووتی: لولاك لولاك لما خلقت الافلاك! [لەبەر تۆ نەبا وتۆ نەبایت، بونەوەرم نەدەخوڵقاند] شەیتان بە زەردەخەنەیەکی پڕ تەوسەوە گووتی:

-ئەو حەدیسە مەوزوعە و ئەسڵ وئەساسی نییە!

-شەیتانیش حەدیسان دەناسیتەوە؟ !

-گەورەم لەو بوارە کارێکی زۆرمان کردوە، حەدیسێکی زۆری خۆمان خستۆتە ناو سەحاح و موسنەدەکان، نابینیت ئەگەر ژمارەی حەدیسەکان دابەش بکەین، هەر حەدیسێك یەك چرکەی بۆ دابنێین، دەبوایە پێغەمبەر بەلایەنی کەم ٥٠٠ساڵێک تەمەنی بوایە و لەو تەمەنەش هیچی نەکردبایە تەنها حەدیس خوێندنەوە نەبێت!

-ئەتوو لەو قسانە گەڕێ تازە بەسەرچوو، ئەو حەدیسانە شێوەی منیشیان شێواندوە، لۆ موحەدیسەکانم لەناو نانەکی گەرم هەڵگرتووە! من زانیومە دکتاتۆرەکان و سەرۆکە ناشەرعیەکان دەیانەوێت بۆیان درێژبکریتەوە، نەمزانیوە شەیتانیش داوای درێژکردنەوە بکات!

-بۆ خودایە وەرە کردەوەکانی ئەوان و ئەمن بەراورد بکە بزانە لەمنیان تێپەڕ نەداوە! هەموو گۆشت خۆرن بەس هەر ناوی شەیتانی داماو بەدە! خەڵکیان بە کۆمەڵ کوشتووە، سامان و سەروەتی گەلانیان تاڵان کردوە، هەزاران خەلکیان بی دادگایی و بێ تاوان زیندوو و وون کردووە، خەڵکیان برسی کردوە لەسەر حیسابی تێرکردنی خۆیان و منداڵ یان، هێشتا داوای درێژکردنەوە دەکەن! ئەمن ئەو عیسانە خوێریانەم بەس ختوکە داون و چرپاندومەتە گوێیان، هیچ هێزێکی جەستەیی و فیزیکیم لە دژیاندا بەکار نەهێناوە!

-قوڕیان بەسەری بزانە کوو بە فریشتەکانی دۆزەخم لە شیشیان دەدەین!

-بەس ئەوان چەندین جار لۆخۆیان درێژ کردیتەوە، دکتاتۆرەکانی ئومەتی محەمەدی ﷺ، تا مردن خەریکی لۆخۆدرێژکردنەوە بوون، چ دەبێ ئەمنیش تەنها جارێکم لۆ درێژکەنەوە؟!

-باشە پێمبڵێ چ تام و لەزەتێك لەو کارەت دەبینی هەتا لۆت درێژ کەمەوە؟!

-من چێژ دەبینم کاتێ مرۆڤەکان کەر دەکەم بە چرپەیەك، دەیانکەمە ڕۆبۆتێکی خۆم، هەموو کارێکی خۆمیان پێدەکەم! من سەدان مەلا و واعیز و موجاهیدم قورمیش کردوە، ئێستا بەبێ ماندوو بوون کار بۆ من دەکەن، لە خەڵکیش وایە لۆ تووی دەکەن! ئەی خودایە لۆ لەو دیکتاتۆرانە ناپرسی چ لەزەتێك دەبینن لە درێژکردنەوەی حوکمی فاشیلیان و کوشتن وگرتنی خەڵك وبەتاڵان بردنی سامانی خەڵك؟! بۆ چێژ لە فەشەلیان دەبینن؟! من وا فاشیل بام پێم شەرم دەبوو هەر باسی درێژ کردنەوەش بکەم، بەڵام وەکی دەبینی چم لەو مرۆڤانە کرد و فیلمم سووتاندن، ٩٨% م لێکردنە دۆزەخی وەک چۆن وەعدم پێدای لە قورئاندا، هەرچەندە بەخوای زگیشم پێ دەسوتێن ئەو هەمووەی لەناو دۆزەخ ببینم سەبارەت بە من، بەڵام خەتای من چییە خۆیان خوێڕین لاوازن!

-خۆ ڕاست دەکەی مەلعون ئەتوو لە ئیشی خۆت سەرکەوتوو بووی، چت بەسەر ئەو مرۆڤە هەژارانە هینا! لەو بەنیادەمانەش باشتری کەمن ناردبوونم بۆ خزمەتکردنی مرۆڤ و بەزەیی و دادپەروەری و دەست وداوێن پاکی! دەباشە خۆ ئەتوو لەوان کەمتر نی، ئەوە دەتنێرمە ئەستێرەکی تر دوو سێ ملیۆن ساڵی رووناکی لێرەوە دوورن، بەڵام مەخلوقاتی بە هێزترن، ئەوەی لەگەل بەنیادەمت پێکرا لەگەڵ وانت پێناکرێت!

-یانی خودای گەورە لۆت درێژکردمەوە؟!

-بەڵێ لۆم درێژ کردیەوە، خۆت ئامادەکە ئێستا کۆمەڵێك فریشتە دەتبەن بۆ ئەو هەسارەیە!

کۆمەڵێك دیکتاتۆرم دیتن لەوانەی لە دنیای فانیدا لۆیان درێژکردبوونەوە بە زنجیر دەیانبردن بۆ دۆزەخ، قەزافی بە قاتێکی سپی و یەخەی خوێناوی هاواری دەکرد: دار دار، بیت بیت، زەنگە زەنگە! سەدامیش لەو جەوە ترسناکە تەماشای دەکرد وشانی هەڵدەبەزین بەدەم پێدەکەنینەوە: هاع هاع هاع، دەیگووت: من دەمگووت ئەو قەزافیە شێتە، باوەڕیان بەمن نەدەکرد، ببینە ئەوە دەمانبەنە دۆزەخیش لای ئەو شەستی مانگە، هەر دروشم لیدەدات! شەیتانیش هەلەکەسەمای بوو لە خۆشی لۆ درێژکردنەوەدا، و شەیتانە بچووکەکان سەرچۆپیان بەستبوو!

گروپی دیکتاتۆران بە زنجیرکراوی بەبەردەمم تێپەڕین، لەخەو بەئاگا هاتمەوە بەدەنگی قەزافی، کە بە دەنگێکی تیژی بەرز هاواری دەکرد: دار دار، بیت بیت، زەنگە زەنگە!

محەمەد هەریری

لەندەن

٢٠١٥/١٠/٩

# بەزمی کوڕەکانی خەلیفە فەعۆ!

خەلیفە فەعۆ زۆر بە تەمەن بوو، لەلای خەڵكیش پیاوێكی زۆر باش بوو، ڕیشێكی نورانی و زەردەخەنەیەكی پڕ بەرائەت هەمیشە لەسەر ڕوخساری دەدرەوشایەوە. خەلیفە فەعۆ دوازدە كوڕ و دوو كچی هەبوو، قەت باوەڕی بە منداڵ مەنع كردن نەبوو، دەیگووت گوناهە مرۆڤ ڕێگا لە ڕزقی خوا بگرێت، ئەگەر خوا ڕوحی دایە نەفسێك، ڕزق و ڕۆزیشی دەدات، من چیم ڕێگای لێ بگرم؟!

منداڵەكانی خەلیفە فەعۆ گەورە بوون، بەڵام چ گەورە بوونەك. هیچ كێشەیەك ڕووی نادا لەو كۆڵانەی دەستی یەكێك لە منداڵەكانی فەعۆی تێدا نەبێ!

ماڵە جیرانەكی خەلیفە فەعۆ ی دزرا، پۆلیس هات و لێكۆڵینەوەی دەست پێكرد، هەر زوو زانیان عەدۆی كوڕی خەلیفە فەعۆ كردیتی. خەڵك دەیگووت : بەداخەوە ئەو كوڕە نەچوویتەوە سەر بابی، ئەو بابە باشە لە كوێ، و ئەو كوڕە دز و بێ نرخە لە كوێ؟! دوای ماوەیەك دەیانگۆت كورە گەنجە بێ عەقڵ بوو غەڵەتەكی كرد، هەزار گوناح و یەك تۆبە!

هێشتا خەڵك دزی عەدۆی لەبیرنەكردبوو، بەردۆی كوڕە گەورەی خەلیفە فەعۆی لەسەر شەڕی منداڵان لە كۆڵانێ شەش چەقووی لە بابی منداڵەكی دا، بە مەرجەكی شەشی دیشی تەرح دابوێ!

خه‌ڵك ده‌یگووت : به‌داخه‌وه ئه‌و كوڕه نه‌چوویته‌وه سه‌ر بابی، ئه‌و بابه باشه له كوێ، و ئه‌و كوڕه چه‌قوو كێشه وبێ نرخه له كوێ؟!

دوای ماوه‌یه‌ك ده‌یانگۆت كوره گه‌نجه بێ عه‌قڵ بوو غه‌ڵه‌ته‌كی كرد، هه‌زار گوناح و یه‌ك تۆبه!

دوایێ له ئێواره‌یه‌كی تاریك هاواری ئافره‌تێك هه‌ڵسا و گوێی كۆڵانی كاس كرد. كه خه‌ڵك به‌ره‌و شوێنی ڕوداوه‌كه چوون، دیتیان له كه‌لاوه‌كه‌ی كۆڵانه‌كه ئافره‌ته‌كی خه‌ڵكی كۆڵان ده‌ستدرێژی بۆسه‌ر كراوه و له خرتۆخۆری وه‌ردراوه. هه‌موو جلی له‌به‌ر دڕاوه، زوو چه‌ند ئافره‌تێك به عه‌با دایان پۆشی، پۆلیس هاتن، ئافره‌ته‌كه گووتی نازانم كێ بوو به‌ڵام قیافه‌ی به كوڕانی گه‌ڕه‌ك ده‌چوو، ئینجا كاتی پڕكێشی ده‌كردم پارچه بلۆكه‌كم كه‌وته ده‌ست كێشامه سه‌ری، و سه‌ریم شكاند. پۆلیس كه‌وتنه پشكنینی گه‌نجانی كۆڵان، ئه‌وه‌ی كڵاو یان جه‌مه‌دانی پۆشیبا ده‌یان پشكنی. كه‌سیان نه‌دیته‌وه.

كابرایه‌ك گووتی باوه‌ڕناكه‌م ئه‌و تاوانه له كوڕه‌كانی خه‌لیفه فه‌عۆی دوور بێت، له‌گه‌ڵ ڕێز و حورمه‌تما بۆ خه‌لیفه فه‌عۆی . خه‌ڵكتێكڕا له كابرای توڕه بوون گووتیان منداڵی ئه‌و پیاوه باشه‌ی هه‌ڵه‌ش بكه‌ن شتیوا ناكه‌ن، كوڕی باوكێكی وا نوورانی كوو شتی وا ده‌كه‌ن؟!

پۆلیسه‌كه گووتی به‌ڵام خراپ نییه هه‌ر بۆ دڵنیاییش بێت به‌دوای دابچین. چوو له ده‌رگه‌ی خه‌لیفه فه‌عۆی دا، گووتی : قوربان ببوره ده‌زانم ناو وشۆره‌تی باشی ئێوه چه‌نده به‌ڵام یاسا

هەر یاسایە، فەرمانم پێکراوە هەموو گەنجێکی ئەو کۆلانە بپشکنم.

خەلیفە فەعۆ بە زەردەخەنەیەکەوە گووتی بەسەرچاو بانگی کوڕانی کرد و گووتی ڕێز بن!

هەموو کوڕەکانی ڕێز بوون، و پشکنینی کەسیان سەری نەشکابوو. خەڵك بە چاوێکی خراپ دەیانڕوانیە ئەو پیاوەی گومانی خستەسەر کوڕەکانی فەعۆی! ئەویش گووتی: بەڵام گەورەم هێشتا قەدۆ مایە، ئەوانە هەموو کوڕی گەورەی ئەو نین!

خەلیفە فەعۆ گووتی: قەدۆ هێشتا منداڵ و هەرزەکارە، ئێستاش خەوتووە، ماقوڵە هەرزەکارێکی وا کارێکیوا بکات تا گوومانی لێبکەیت؟!

پۆلیسەکە گووتی:قەیناکا خەلیفە گیان هەر لەبەر خاتری من لە خەو هەڵیستێنن با بێت.

قەدۆ یان بە چاوێکی خەواڵوو هێنا، هەر پازدە شازدەساڵێك دەبوو. هیچ سەری نەبەسترابوو! پۆلیسەکە لێی نزیك کەوتەوە گووتی ناوەندی سەرتم نیشان دە، ئەویش بە شڵەژانەوە چەمایەوە پۆلیسەکە دەستێکی بەسەر سەری داهێنا بە توندی، قەدۆ وەك بڵێی کارەبا لێیدا بێت توند هەڵزەنی و گووتی ئای!

دیاربوو سەری شکابوو، قەدۆ هەر لەوێ دانی بە تاوانەکەی نا، و خەڵکەکە هێشتا بە چاوێکی مۆن و خراپ دەیانڕوانیە ئەو کابرایەی بووە هۆی ئاشکراکردنی ئەو تاوانە و دیسان خەڵك

ده‌یگووت : به‌داخه‌وه‌ ئه‌و كوڕه‌ نه‌چوویته‌وه‌ سه‌ر بابی، ئه‌و بابه‌ باشه‌ له‌ كوێ، و ئه‌و كوڕه‌ به‌دڕه‌وشته‌ وبێ نرخه‌ له‌ كوێ؟! دوای ماوه‌یه‌ك ده‌یانگۆت كوره‌ گه‌نجه‌ بێ عه‌قڵ بوو غه‌ڵه‌ته‌كی كرد، هه‌زار گوناح و یه‌ك تۆبه‌!

حوكمه‌ت توانیبووی چه‌ندین سیخوڕی خۆی له‌ناو تیرۆرستانی ماعش بچێنێت، ڕۆژێكیان هه‌واڵیان بۆ هات كه‌ گروپێكی چوار كه‌سی خۆكوژ دزه‌یان كردۆته‌ ناو شار، هه‌موویان كورد نین و شاره‌زای هیچ نین، پاش چاودێریه‌كی ورد دیتیان دوو له‌ كوڕه‌كانی خه‌لیفه‌ فه‌عۆی و كه‌سێكی تریش چاوساغیان ده‌كردن. پێش ڕوودانی ته‌قینه‌وه‌كان هه‌موویان گیران و ئه‌و ئێواره‌یه‌ له‌سه‌ر ته‌له‌فزیۆن ده‌ركه‌وتن. خه‌ڵكی كۆڵان هێنده‌ی دڵیان به‌ ئازار بوو بۆ ناوزڕاندنی خه‌لیفه‌ فه‌عۆی وه‌ك پیاوه‌ نورانی و پاكه‌كه‌، هێنده‌ كه‌یف خۆشنه‌ببوون به‌ ئاشكرابوونی ئه‌و تاوانه‌ به‌ر له‌ ڕوودانی!!! به‌ڵام چونكه‌ كوڕه‌كانی خه‌لیفه‌ زوو به‌ربوون به‌ واسته‌ی به‌رپرسێكی گه‌وره‌ خه‌ڵك به‌ خۆیان دیعایه‌كی خۆبه‌خشانه‌یان لۆ ده‌كردن و ده‌یانگۆت دوو كوڕه‌كه‌ی خه‌لیفه‌ فه‌عۆی خه‌ت مایلبوونه‌ و ئه‌و تیرۆرستانه‌یان ئاشكرا كردیه‌! دوای ماوه‌یه‌ك هه‌نده‌كیشیان ده‌یانگۆت كوره‌ گه‌نج وبێ عه‌قڵ بوون، له‌به‌ر به‌دینی وایانزانیه‌ خێره‌ یارمه‌تی ئه‌و تیرۆریستانه‌ بده‌ن، غه‌ره‌ته‌كیان كردیه‌ به‌ نیه‌ته‌كی پاك! هه‌زار گوناح و یه‌ك تۆبه‌!

كه‌مه‌كیش خه‌ڵك ده‌یگووت : به‌داخه‌وه‌ ئه‌و كوڕانه‌ نه‌چووینه‌وه‌ سه‌ر بابی خۆیان، ئه‌و بابه‌ باشه‌ و پاكه‌ له‌ كوێ، و ئه‌و كوڕه‌ تیرۆرست و خائین وبێ نرخانه‌ كوێ؟!

ماوەیەك بوو دەنگۆی هاتنی چەند سۆزانیەك بۆ کۆلان بڵاوببەوەوە، گەنجە مەحرومەکانی گەڕەکی هەمووی قەڵۆش کرد بوو، خەڵکی گەڕەك شکاتیان کرد ورۆژەك پۆلیس بەسەری داداان وسێ چوار ژنی گەنجی سۆزانیان لەماڵەوە دەرهێنا، کە لێپێچینەوەیان لەگەڵ کردن دانیان بە کارەکانیان داهێنا وگووتیان ئێمە لە موسڵەوە لەگەڵ ژنەکی ئەو کۆلانە هاتین بۆ ئیش، ناوی ڕەقۆ یە ژنی خەلیفە فەعۆیە!!! ئەو موشتەریمان لۆ دەینی!

کە ڕەقۆ یان هێنا بۆ بنکەی پۆلیس بەخۆ و بە مۆبایل و تۆپە بنیشتەکی زاری، نکوڵی لێکرد و هەر زوو چەندین بەرپرس تەلەفۆنیان کرد بۆ بەرێوەبەری بنکەی پۆلیسەکە و مۆبایلیرەقۆی کە نابێت ڕەقۆ تاوانبار بکرێت!

خەڵك کەمێك کەوتبوە گومان لە ڕەقۆی، بەڵام زۆربەیان دەیانگووت موستەحیلە باوەڕ بکەین خەلیفە ژن کاری وا بکات، دەنا ژنی ئەو خەلیفە نورانی و بەدینەی نەدەبوو!

ئەو کابرایەی کە تاوانی لاقەکردنەکەی ئاشکرا کردبوو هاواری دەکرد: ئەرێ خەڵکینە لۆ وا ساویلکە وبێ مێشکن؟!

عەدۆ دزی کرد هەر گۆتتان خەلیفە فەعۆ جیایە پیاوێکی پاك و نورانیە!

بەردۆ باوکی منداڵێکی کردە بێژینگ بە چەقووی هەر گۆتتان خەلیفە فەعۆ پیاوێکی پاك و نورانیە!

قەدۆ تەعەدای ناموسی لە ئافرەتی گەڕەکێ کرد هەر گۆتتان خەلیفە فەعۆ جیایە پیاوێکی پاکو نورانیە!

ڕەعۆ و سەعۆش لەسەر یارمەتی تیرۆرستان گیران، کە بە واستە بەربوون زۆربەتان لۆتان کردنە خەبات یش، کەمەکیشتان هەر گۆتتان ئەوانە نەچووینەوە سەر ڕێی خەلیفە فەعۆ!

ڕەقۆی ژنی لە بازرگانی لەشفرۆشی گیرا، چونکە بەر بوو بە زەبری بەرپرسە داوێن پیسەکان، کە لە کاتی هەڵبژاردن ماڵی خەلیفە فەعۆی باشترین هەڵمەتیان لۆ دەکەن، و خەڵکێکی زۆری ساویلکەی فریوخواردوو بە پاکی خەلیفە فەعۆ، دەنگیان دەخەنە خزمەت باوەڕیان بە خەلیفە فەعۆی.، هێشتا باوەڕتان نەکرد!

پێم ناڵێن ئەنگۆ بە چ باوەڕ دەکەن کە منداڵەکانی خەلیفە فەعۆی و کارەکانیان ڕەنگدانەوەی خەلیفە فەعۆین؟! ئەگەر فەعۆ هێندە پاك و بێگەرد با، ماقولە هەموو منداڵ و کارەکانیان وا هیچ و پوچ بان؟!

کابرایەکی تورەی گرژ لێی ڕاست بوەوە گووتی: هەی مولحیدی چاو هەڵنەهاتوو بە پیاوی ئیماندار، کێ هەیە غەرەت و گوناحە نەکات؟! دەتەوێ ئەو هەموو مێژوو و پاکی ئەو پیاوە پاکەی بشێوێنی سەبارەت بە یەك دوو غەرەتی منداڵەکانی؟!

لەو قسانە بوون خەلیفە فەعۆ بەدیار کەوت بە سیمای هێمنی و زەردەخەنە بەریئە هەمیشەییەکەی وەك بڵێی هیچ ڕووی نەداوە، دەیزانی منداڵەکانی سەد ئەوەندەش خراپەی بکەن، ڕای

خەڵك لەسەر پاكی و بێگەردی ئەو قەتناگۆڕێ، چونكە لەگەڵ شیری ئەو ڕایەیانلە مێشكی نابوون، و دەیزانی خۆشەویستی ئەو لە دڵی خەڵك سابیتە نەك عاریز .

لەندەن

٢٠١٥/٩/٦

# سەگەکەی یوئێن UN!

١

سەگەکە بە هەموو توانایەکی خۆی رایدەکرد، پاش ئەوەی ئۆتۆمبیلی خاوەنەکەی کە بەرپرسێکی گەورەی یوئێنە لە کوردستان تەقەی لێکرا لەلایەن چەند چەکدارێکی دەمامکدار و وەرگەڕا لە قەراغ ڕێگاکە.

ڕوداوەکە لە نزیك دەروازەی شار بوو هێندەی نەبرد سەگەکەی یوئێن بە سەرگەردانی گەیشتە ناو شار، لە یەکەم گەڕەکی شار دڵی زۆر خۆش بوو کە کۆمەڵێك منداڵی ١٠ دوازدەساڵی یاریان دەکرد، سەیری پێهات ئەو هەموو منداڵە چۆن لەو جادەیە بچووکە کۆبونەتەوە بۆ یاری کردن، لە کاتێکدا لە ئەمریکا لە یاریگا لۆکالیەك هێندە منداڵ لە ڕۆژی پشوەکاندا کۆنابنەوە!

دڵی خۆش بوو کە کەمێك لێیان نزیك کەوتەوە، دیتی هەموویان بە زەردەخەنەوە لێیان دەڕوانی، بۆبی، کە ناوی سەگەکەیە، لە دڵی خۆی گووتی: منداڵ هەمیشە میهرەبانتر و باشتر بوون لەگەل سەگدا، کاتێ لە شارەکەی دەردەکەوت بۆ پیاسەی ڕۆژانە لەگەڵ خاوەنەکەی مستەر جەیمس، سەدان منداڵ لە باوەشیان دەکردن و ماچیان دەکرد، تا ڕادەیەك وادەزانێت، ئەو سەگی هەموو منداڵ و کچانی شارە! کچی شۆخ وشەنگی شار نەماوە ستایشی نەکەن و دەستی بەسەردا نەهێنن! خەڵکەکە بە

گەنج وپیرەوە سوگیان خۆش دەوێت، بەلام هەر منداڵ میهرەبانترینن!

دیتی لەگەل نزیک بوونەوەی بە هێمنی هەر منداڵێکی چەمایەوە بۆ ئەرز و شتێکی هەڵگرتەوە، تێڕوانینێکی زۆر نامۆ لە چاویاندا هەبوو لە هی منداڵانی نەدەکرد! تێکڕا سەد بەردی بەهێزیان تێگرت سەر و گوێلاکیان شکاند! تووشی شۆك هات بە لورە لوور هاواری لێ هەستا و ڕایکرد بۆ دواوە، منداڵەکانیش تێکرا ڕایان کرد بە دواییدا بە بەرد تێگرتن، ژنانی گەڕەکیش بە پێکەنینەوە سەیری دیمەنەکەیان دەکرد!

سەیری پێهات نە ژنێك، نە گەنجێك، نە پیاوێك دەستی ئەو منداڵانە ناگرن، و زگیان بە سەگێکی لێقەوماو و غەریب ناسوتێت! سەیری بەوەش هات، ئەو هەموو منداڵە لەو گەڕەکەن، یەك سەگیان پێ نەبوو! بڵێی ئەو وڵاتە سەگی لێ بێت، یان سەگەکان وەك من راونراون! باشە بۆ  ئەزیەتمان دەدەن، بۆ وا ڕقیان لێمە، خۆ من هیچم نەکردوە؟! ئەو هەموو دڵ ڕەقیە چۆن لە دڵی ئەو منداڵە وردیلە و جوانانە جێی دەبێتەوە؟! منداڵان لای ئێمە ساندویجی خۆیان دەبەخشنە من، یاریمان لەگەڵ دەکەن، لە باوەشمان دەگرن! ئەوانە لە خۆڕایی ئەو هەموو بەردەم لێدەدەن!

خۆی لە پەنا دیوارێك شاردەوە لەناکاو یەك سەتڵ ئاوی کرا بەسەری بەو سەرمایە، چاوی بەرز کردەوە دیتی کچێکی

جاحێڵی جوان لە قاقای پێکەنینی داوە و هاواری لای منداڵەکانی دەکرد!

بۆبی تا هێزی تێدا مابوو ڕایکرد بەرەو ئاقاری، لە دڵی خۆی دەیگووت: ئەی هاوار هەتا کچی جوان جاحێڵیش ڕقیان لە ئێمەیە، تووشی چ وڵاتێك هاتووم! بڵێی سەگێکی هاوشێوەی من کارێکی خراپی نەکردبێت لەو ناوە؟!

بەس وەك زانیومە سەگی وەك من [گێرمان شیپەرد] لەو وڵاتە نییە، یانی هیچ سەگێك نیە بە من بچێت! ئەی باشە بۆ دەبێت وا ڕقیان لێم بێت؟!

لە دوورەوە لەو ئاقارەی چەند تارمایەکی ڕەوە سەگێکی دی، کە حەپە حەپیان بە ئاستەم دەهات. دڵی کەمێك خۆش بوو کە هەر نەبێت چەند سەگێکی دۆزیەوە بەڵکو یارمەتی دەدەن، و دەیپارێزن لە دەست منداڵە چەتوونەکان! بە ڕاکردن بەرەو لای ئەوان رایکرد، کە نزیك بوەوە بۆن بۆگەنی زبڵخانەکە مێشکی کاس کرد و هێڵنجی دەهاتەوە، کە نزیك کەوتەوە دە دوازدە سەگی پیس و ڕەش هەڵگەڕاو لە قڕێژدا، بە هەمان زەردەخەنەی منداڵەکان بۆیان دەڕوانی، دەیان لاشەی گوێدرێژ ومەڕی تۆپیو لەو ناوە سکیان هەڵدرابوو و ڕیخۆڵە ا هەناویان بە دەرەوە بوو، کە زیاتر نزیك کەوتەوە سەگەکان هەموو دەم و قەپۆزیان لە خوێندا نابوو!

هەستی بە بێزهاتنەوە و ترسێکی زۆر کرد، ئەوانە چین لە ڕای خوا؟! سەگن یا خێون؟! کورە چەند دوژمنکارانە بۆم

دەڕوانن، بڵێی ئەوانیش وەك دوو پێیەكان دڵ ڕەق بن بەرامبەری؟!

هەر كە نزیك بوەوە بە كۆمەڵ بە حەپو حەپەوە هێرشیان بۆ برد ڕاكە...ڕاكە، تا لە دەستیان ڕزگاری بوو سەد گازیان لێگرت!

بە لورە لور و كروزانەوە ڕای دەكرد لە دەستیان بە هەزار حاڵ رزگاری بوو!

گەیشتە زورگەكی دیتی سەگێک هەڵكورماوە، هەر كە بۆبی دیت رایكرد بە شەلە شەڵ پێیەكی بەدوای خۆی رادەكێشا، بۆبی بۆی ڕایكرد گووتی راوەستە خوشكم بۆ ڕادەكەی خێرە؟!

- وەڵلا چوزانم لە ترسی توو؟!
- بۆ وادەزانی گاز وقەپ دەگرم؟!
- ئەی سەگت دیتیە گەزە و قەپ نەگرێت؟! مرۆڤەكانیش لەو دەڤەرە قاپ وگاز دەگرن!
- ئەرێ وەڵڵا سەگی وڵاتی من بە دەگمەن نەبێت قاپ ناگرن! قاپ بۆ بگرن لە كاتێكدا هەموو خواردنیكیان بۆ دەكردرێت لە سوپەر ماركیتەكان، و هەموو خۆشەویستی وبایەخیان پێ دەدرێت!
- سوپەر ماركت؟! ئەو شتە چییە؟!
- ئەو بازارە گەورانەیە كە هەموو خواردنی وشك و شل و تۆزی لییە، گۆشت وڕووەكی لێیە!

- ئێ ئێ لێرەش هەیە لە دوورەوە دیتیتم، هەموو ئاواتم ئەوەیە رۆژەك بەس بەناوی دا تێپەڕم، کورە بابە خواردنم ناوێ!
- من هەزاران جار چووم کە مستەر جەیمس دەیبردم بۆ ئەوێ یەکسەر دەیبردمە لای خواردنی سەگەکان!
- توو ئەو خوایەی لەناو ئەو دووکانە گەورانە جێگای خواردنی سەی هەیە؟!
- بەڵێ جێگای خواردنی سەی هەیە بە تایبەتی! سوێندی بۆ چیە، من هەر باوەڕم بە سوێند نییە؟!
- یەعنی باوەڕت بە خوای نییە هەی سەگی سەگباب؟! وەڵلا بکەویە دەستی جەماعەتی بۆرەی هەللا بە هەللات دەکەن، جارەکیتر لای کەس کوفر وشتی وا نەکەیت، کە چویەوە کاولەکەی خۆتان ئەو قسە قەڵەوانە بکە! کورە پێم ناڵێ سەگێکی خوێری ئاوەگڵی وەکو ئێمە چییە تا باوەڕی بە خوا و سوێند هەبێت یان نا؟!

وەڵڵا بابە تەواومان کرد سەش بوونە بەشەر! کورە سەی وەکی مە، کوو خواردنیان لەگەڵ خواردنی مرۆڤ دەفرۆشرێت؟ ئەمە مردین هەندی نانە وشکە بخۆین، لەبەر بێ گۆشتی هەموو بوینە رووەکی!

٢

- کورە کاکە من نەمگوتوە باوەڕم بە خوا نییە، من دەڵێم باوەڕم بە سوێند خواردن نیە، چونکە سوێندخواردنی

زۆر کاری درۆزنانە، ئێوە بۆ وا بە پەلەن بۆ کافرکردنی خەڵك، پێم نالێی جەماعەتی بۆرەی کێیە؟!

- مەمنون بە منێکی بێ دەسەلات و قاچ کاو گوێم لێبوو، ئەوانە جەماعەتێکن لەسەر ئەو زبڵخانەی ئەو هەورازەینە، ئەوەی یەك قسەی قۆڕی کوفر بکات سکی هەڵدەدڕن!
- دیتیانم ئەوان بوون هێرشیان کردە سەرم وسەد قاپیان لێگرتم. ئەتوو بە من نالێی بۆ وا پێت بەدوای خۆت ڕادەکێشیت؟
- وەڵلا کۆمەڵە گەنجێك بە گولـلە نیشانەیان لەمن دەگرت هەر لۆ فشەی، بێ ئەوەی هیچم کردبێت! بەخوای پیاو بوون!
- هەر لەو گۆڕەی لییان دای بێ هۆ؟!
- هۆی بۆ چیە، ئەوە بەشێك بوو لە سەیرانیان! بەسە سەگ بیت هەموو کەس بە چاوی دوژمنکاری سەیرت دەکات، گەورە وبچوك، و نێر و مێ، و دیندار و بێ دین!
- باشە دیندار بۆ؟ خۆ ئەوەی من بزانم دینەکان هانی بەزەیی دەدەن لەگەڵ ئاژەڵ!؟
- ئەمنیش وام گوێ لیببوو، دەڵین لە مزگەوتەکان باسی ئەوەیان کردوە کە پیاوێك ئاوی بە سەگێکی تێنوو داوە، لە ئەنجامدا خوا بۆ بەهەشتی ناردوە، بەس دەڵێن پیاو چاکەکی بەرایی لایەنگری پشیلەی بووە، چەند قسەی خەراپ هەیە لەسەر ئێمەی سەگی کردیە

تەفنیشی کردین! کورە دەڵێت ئەوەی سەگ ڕاگریت بۆ غەیری کشتوکاڵ و ڕاو خودا غەزەبی لێدەگریتن و ڕۆژانە تەنەکەیەک یان دوو تەنەکە چاکەی لێ کەمدەبێتەوە! دەڵیت پێغەمبەری خۆشەویست گوتیتی: ئەگەر سەگ ئومەتێك نەبا ئەمرم دەکرد بە کوشتنی هەموویان، بەڵکو دەڵێن هەر ئەمری کردوە بە کوشتنیان، بەلایەنی کەم فەرمانی بە کوشتنی سەگە ڕەش ڕەنگەکان کردوە، وەك کابرای لایەنگری پشیلەی دەڵێت چونکە شەیتانن! بەخوای ئەمن باوەڕ ناکەم ئەو قسەیە بێ سەروبەرانەی کردبی، من خۆم برایەکی ڕەش ڕەنگم هەبوو، دە وەڵلا لە هەموومان باشتر و بەڕەحمتر بوو، شەیتانی چی و حاڵی چی!؟ لەو وڵاتە بۆیە هیج سەگێکی ڕەش ڕەنگ نابینیت، چونکە خەڵك پێی شەیتانە بە نەسی حەدیس!

- یەعنی هەموو دیندارەکان وا لیتان دەڕوانن؟!
- ئەرێ وەڵلا چونکە ئەو وڵاتە شافیعی مەزهەبن کە تووک و لیکی سەگی پێ پیس و نەجیسە، لۆیێ کەس بە چاوی بەزەیی و خۆشەویستی لێمان ناڕوانن! لەوبەریش شیعەش وەك شافیعیەکان ئێمەیان لێ بویتە شەیتان!

دەلێن لە وڵاتانیتر بە تایبەتی مالیکیەکان ئەمەیان پێ ئاوەگڵ ونەجس نییە، باشترە خەڵکەکەی! بەران من هیچم نەدیتیە لە لێدان و سەروەدوونان زیاتر!

- کورە ئەمن مردم لە برسان شتەکت نیە بخۆم؟!

- وەڵلا پارچە نانێکی وشکم هەیە با لۆ تۆ بێت فەرموو.
- یەع ئەوە چیە کەڕووی گرتووە؟ کەسک کەسکە!
- ئەدی پیتوایە خواردنی سوپەر مارکێتی سەیانە؟! خۆزگەم بە خۆت باشیان بەناز کردی! بەس خۆزگە دەمزانی چ کەرایەتیەک تۆی هینایە ئێرە؟! وەڵلا تا مای لیرە پاروە نانێکی پاك و هێمنانە ناخۆیت. ئەو وڵاتە جاروبار گەنجانی بە چەکەوە دێن یەك یەك ڕاومان دەکەن بە دەم قاقا و پێکەنینەوە، دەڵێن خێریشیان لۆ دەنووسرێت بە کوشتنی سەگان! کوشتنی هەر سەگەکی بە قەد یەك کەلاشە مانگا خیریان لۆ دەنوسرێت!
- ئۆ مای گۆد! تۆ بە ڕاستیتە؟! ئەدی حوکمەت و پیاو ماقوڵان و عاقڵەکان هەڵوێستیان چیە؟! لە کنە مە ژنێك سەگەکانی بە برسی جێهێشتبوو، لە دادگا سزا درا بە زیندانی کردن هەرچەندە خاوەنی سەگەکانیش بوو!
- کێ بەرگری لە سەگەکان کرد، ئەگەر خاوەنەکەی خۆی تاوانبار بێت؟!
- حوکمەت و میدیا و ڕای گشتی دنیایان هەراسان کرد لەسەر ئەو دڵ ڕەقییە!
- وەڵلا خۆشە ئەو وڵاتە لیرە حوکمەت خاوەنداری لە مرۆڤەکانیش ناکات تا بە سەیان ڕادەگات! باوەڕ بکە کچی وا جوان و نازدار دەهێننە ئەو جۆلایەتیەی دەیکوژن و بەجێی دەهێڵن، دەڵێیت مانگن لە جوانی! بۆیە من زگم بە خۆمان ناسوتێت، ئەو مەلعونانە کچی

وا جوان و ناسك لەو چۆڵەوانیە دەکوژن بە تەمای کوو بن لەگەڵ سەگبابێکی وەك ئێمە؟!

دەڵێم من ناوم کسۆکی خزمەتکارتە، ئەتوو ناوت چیە؟

- بۆبی..
- بۆبی دەڵێم ئەگەر وەك من پیتان بشکێت، عیلاجتان دەکەن؟!
- هەر عیلاج، دەمان بەن بۆ پێت کلینیک و پارەیەکی زۆریشمان لێ سەرف دەکەن! شەش مانگ جارێك دەرزیەکمان لیدەدەن بە پێنج سەد پاوەند!
- یەعنی ئەنگۆ لە بەهەشتینە، دەرێم لۆ لەگەل خۆتم نابەی لۆ لای خۆتان!
- با ئەمن بتوانم بگەڕێمەوە!
- ئا بەڕاستی پێت نەگوتم بۆ هاتی بۆ ئێرە هەی بێ عەقڵ؟!
- کورە ئەمن لێم قەومایە، لەگەڵ مستەر جەیمس هاتم بۆ ئەو وڵاتەی کە کوردستانی پێدەڵێن، ئەمەیان دایە بەر گوللە و نازانم چ ڕویدا و خوێنێکی زۆرم دیت لە جەستەی جەیمس، ساتێك مامەوە دوایی منیش ڕامکرد، چونکە منیشیان دایە بەر گوللە!

لەو قسانە بوون گرە گڕی چەندین ئوتۆمبیل هات، پۆلیسەکان بە چەکەوە دابەزین دەستیان کردە تەقە

کردن لێیان، کسۆك وبۆبی دەستیان بە راکردن کرد، بۆبی گووتی:

- ئەتوو پێمنالێی ئەوانە کێن؟
- پۆلیسی حوکمەتن!
- چما حوکمەتیش سەیان دەکوژی!
- بەڵێ فەرامۆشمان دەکەن و ڕاومان دەنین بۆ ناو زبڵخانە، دوایی دەشڵێن ئەو سەگانە گڵاون و پیسن دەبیت بکوژرێن! وادەزانن ئێمەیان لە سوپەر مارکت بەخێوکردوە! بابەخۆیان ڕۆژیك بێنە ناو ئەو زبڵخانە و پیساییە بزانە سەگ بێزیان لێ ناکاتەوە، کی ناڵی کاتی خۆشی کە ڕابەرانی دینی هەر لەبەر ئەو هۆیە فەرمانیان بە کوشتنی ئێمە کردبێت! باشە ئەو کات سوپەر مارکێت نەبوو، خۆ ئێستا هەولێر هەر هەزار نەفەری سوپەرمارکێتەکیان بەر دەکەوی!...ئاخ لێیان دام بۆبی غاردە غاردە، بگەڕێ خاوەنەکەت ببینەوە، هەموو ژیانت بگەڕێی باشترە لەو سەگمەرگیەی ئێرە، لێرە ڕەحم بە مرۆڤەکان ناکەن، نابینی چۆن پۆڵ پۆڵ خاکیان بەجێ دەهێڵن، دەتەوێ دڵیان بە سەگی قورِبەسەر بسوتێ، یان بە گوێدرێژ و ئاژەڵەکانیتر! بڕۆ بگەڕێ بەدوای خاوەنت... ڕاکە تا هێزت تێدایە ... ڕاکە... ئەو وڵاتە بە کەڵکی ئینسان نایەت، چۆن جێگای سەگی ئاوەگڵی لێدەبیتەوە، ڕاکە... ڕاکە...

٢٠١٥/١٠/٢٦

سەرنج: بیرۆکەکەی ئەو چیرۆکە لە کاتە نالەبارەکانی نەوەتەکانی کوردستان لە خەیاڵم کەڵکەڵەی دەکرد، هەر دەرفەتم نەبوو بینووسم، تا لە ٢٠١٥/١٠/٢٦ لە لەندەن نووسیم.

# گلەییەکانی عابیدێکی خەڵەفاو لە خوا!

١

ئەخر خودایە گیان خۆت هێندە زانا و گەورەی، پێویست بە کەس ناکات شتت پێ بڵێت و فێری شتێکت بکات! بەڵام من زۆرجار دەڵێم لەوانەیە لەبەر زۆر بوونی ژمارەی عیسانەکان و حەیوان و تەیر و ئەو هەموو حەشەراتانە، نەتوایت گوێ بۆ ڕاز و نیازی عاشقێکی وەک من و ڕێبواری ٩٠ ساڵەی ڕێگای تۆ بگریت!

ئەستەغفیروڵلا خودایە لێم مەگرە لەسەر گێلاتی و خەڵەفاویم حسێبی کە، ئەخر خۆت دەزانی قوربان من پێم ناوەتە ناو سەد ساڵیەوە! چەندین جار لە مەلام بیستییە خوا لە بێ عاقڵ و شێتەکان ناگرێت، و قەڵەمیان لەسەر هەڵگیراوە! خواگیان لۆ خاتری گەورەیی خۆت بە شێتێک و کەم عەقڵ حسێبمان کەیت، ئەو هەموو تەمەنەمان کە لە عیبادەتی تۆ بردۆتە سەر لە سفری نەدەیت خوایە گیان! خودایە لەو موفلیسانە نەبم کە مەلا لە خوتبەی دەیان جار باسی کردوە، کە بە درێژایی ژیانیان عیبادەی تۆیا کردوە، بەڵام لە ئاخیترەتدا تەرازوویان بەتاڵ و حاڵە! بە دەستی خاڵی دێنە بەردەمت!

خودایە ئەتوو دەزانیت من لە دە ساڵیەوە لە نان و ئاو دابڕا بم، لە عیبادەتی تۆ دانەبڕاوم! یانی ٩٠ ساڵە عیبادەتی تۆ دەکەم، نوێژم بە دەگمەن نەبێت بێ جەماعەت نەبووە! بیرم نایەت

ڕۆژێكی ڕەمەزانم خواردبێت، لەوەتی فێری خوێندنەوەی قورئانیش بووم، هیچ ڕۆژێكم لێ ئاوا نەبووە قورئانم نەخوێندبێت، هەزاران خەتمی قورئانم كردوە! هەرچەندە هەر بە هەژاریش ژیاوم بەڵام دینارێكم لێ زیاد بوو بێت داومەتە كەسێكی لە خۆم هەژارتر...

- ئەستەغفیڕوڵلا من منەتی عیبادەتی خۆم بەسەرتەوە بكەم خوایە گیان، توخواكەی بە وڕێنەی شێتێكی لە قەڵەم بدە، خودایە كار و كردەوە چاكەكانم بەتاڵ نەكەیتەوە، ئەو فریشتانە هەزاران ساڵە خزمەت و عیبادەتت دەكەن، كەچی باوەڕناكەم نیوە وشەیەكی منیان دركاندبێت!
- بەس خۆ من ئینسانم مەلایكەت نیم! ئەوان نە نانیان پێویستە، نە ئاو، ونە خزمەت، و نە ناز، و نە میز و نە گوو كردن!

بەخودای خوایە دە هەزار ساڵیش عیبادەتت كەم، وەك ئەوە وایە هەر هیچم نەكردبێت، هەرچەندە خۆشت دەزانی دڵسۆز بوون بۆ تۆ چەندە قورسە!

خۆم لە هەزاران ئیغرا لاداوە لە ترسی مەقامی تۆ! خۆم لە خواردنی پارەی زۆر لاداوە لەبەر حەڕام وحەلال! خۆم لە هەزاران شایی و هەڵپەڕین لاداوە لەبەر ڕەزامەندی تۆ، لە هەڕەتی لاوێتیمدا كە زۆریشم حەز لێ بوو بچمە ناو شایی و دەستی كیژۆران بگرم، و وەک جاحێرەكانی گوندی ئەمنیش

كەمەك هەڵپەڕم! وەی چەند جاران ئەسمەر و بەسێ و مامر بە ئاشكرا پێیان دەگۆتم لۆ نایە ناو شایی! ئای كوو قرچەم لە جەرگی دەهات، بەس لەبەر ترسی توو، تۆ و بەس، ڕەتم دەكردەوە! پێیان دەگۆتم ئەوە هەر پیاو نییە، نێرەموكە، دەنا كوو هێندە بێ مرازە لە كچان!؟

هەتا ژنم نەهینا و منداڵمان نەبوو، كەس باوەڕی نەدەكرد من پیاو بم بە مانای وشە! كورە ناهەقیشیان نەبوو، بەخوای ترسی عەزاب و ئاخیرەت وای لێكردبووم، خەڵك بە دێوانە و كچانیش بە ناپیاوم بزانن!

بەس ئەو جۆرە ژیانەی من بۆ خۆم هەڵم بژارد، لە عیبادەتی تۆدا، ئەلحەقی ڕێز وپایەیەكی زۆریان لەناو خەڵك پێ دابووم، وەك شێخێك داوای دووعا و دەست بەسەر نەخۆش داهێنان و نووشتی بۆ كردنیان لێ دەكردم! خۆت دەزانی من لە چ هەژاریەك تا ئەمڕۆش ژیانم بەسەر بردوە، دەشمتوانی وەك شێخە درۆزنەكانی شارەكە وەك پاشا بژیم، بەڵام ئەوەشم لەبەر ترس و خۆشەویستی تۆ نەكرد! هەر بە خۆڕایی دوعا و نزای خێرم بۆ خەڵكەكە دەكرد، هەزاران كەسم بە ئامۆژگاریەكانم لەگەڵ تۆ ئاشت دەكردەوە! بەپێی خۆم دەچوومە لای نەخۆشەكان بەسەرم دەخوێندن!

- بەخوای حاجی مستەفا زۆر لە خۆت گۆڕاوی، كورە عەیب ناكەی تەمەنی تڕەك و فسەكت ماوە، كەچی وا وڕێنە دەكەیت

و خۆت بادەدەیت بە عیبادەت وكارە چاكەكانت؟! تازە كاری چاكەی چی مایەوە؟! دەبێ مەمنون بیت خوا لێی وەرگرتبیتن!

- ئەخر لۆ وەریناگری، خۆ بە دڵسۆزی بۆ ئەوم كردوە، دەنا دەمتوانی خۆم و منداڵەكانیشم پێی دەوڵەمەند بین! لە شارەكە ناوی من وەك ئەسحابەیەك دەهێنرێت!

- هەر ئەوەشە وا لە خۆبایی كردی، كورە ئاگاداربە شەیتان لەو دوا ساتانەی تەمەنتدا زەفەرت پێ نەبا، جونكە مرۆڤ هەبووە سەد ساڵ زیاتر عیبادەتی كردوە، دوایێ كارەكی خراپ دەكات وەک حەدیسەكە دەڵێت بەرەو دۆزەخی دەبات!

٢

- پەكوو بەس ماقوڵە خوا هەندە بە هەنجەت وبیانوو بیت لە عەبدێكی ترکەنی زەعیفی سەد ساڵی لە عیبادەتی ئەو سەرف كردبێت، بە چەقەنەیەك بیخاتە دۆزەخ؟!

- كورە حاجی مستەفا ئەتوو خەرفای، ئەدی شەیتان نزیكترین مەخلوقی خواپەرستی خوا نەبوو؟! لە بیرت چوو بەس لەبەر سوژدە نەبردن لۆ ئادەمی كوو بوە ئەو شەیتانە ڕەجیمە؟!

- وەڵلا وایە، دەك بە نەعلەت بی شەیتان، خودایە بەس بەخوای زگم بە شەیتانیش دەسووتێ!!! ئەخر ئەمن بەو ٩٠ ساڵەم لە عیبادەتی تۆدا حەزدەكەم نازم بكێشی، وگلەیی و بۆڵەبۆڵت لەسەر دەكەم، ئەدی ئەو شەیتانە قوڕمساغە دەڵێن هەزاران ساڵ لە عیبادەتی تۆ دابووە، كوو دەبی لەسەر

سوژدەیەك بۆ ئادەم، بۆ تۆش نا! ئەوها سزای بدەی، ئەخر گوناهە! هەنکە ئەو نەبا ئەمەش هێندە فریومان نەدەخوارد بە دەستی، و لە بە هەشتیش نە دەهاتینە خواریٚ!

- کورە حاجی مستەفا ئەستەغفیرولای بکە، دەرێی زەندیقەکانی لەوچە لەوچ دەکەیت، زگت بە شەیتانیش دەسووتیٚ؟! کورە بابە خەرفایمە خەرفای خوا لێم ناگری، بەس بەخوای لە جاحێڵیەوە ئەو بیرۆکانەم بۆ دەهات، نازانم بۆ؟! دیارە حاجی دەتەویٚ ئەتووش منەت و ناز بکەی بەسەر خوا بە عیبادەتەوە؟!

- کورە ناوەڵلا منەت ونازی چی؟! قوربانی خوا بم، نازیش بکەم لەبەر خۆشەویستیم بۆی نازی بەسەرەوە دەکەم، قەت منالٚی هەتیوت دیتوە ناز بکات بەسەر باوەژنێکی خوانەناس یان ئەوانەی بە ناچاری بەخێوی دەکەن لە دوای دایك وباوکیەوە؟! منالٚ هەر ناز بە سەر دایك وباوکی خۆی دەکات، خواش لە دایك وباوک خۆشەویسترە بۆ مرۆڤ، بۆیە ناز ومنەت دەکەم پاش ئەو هەموو ساڵانەوە!

دەزانی ڕاست بڵێم نازانم ئەوە هەمە بەرامبەر خوا ناز و منەتە یان گلەیی! ئەخر کوو گلەیی نەکەم، ئەمن زەلامەك بم لە درێژایی ژیانم هێندە بیٚ نیاز بووم لە خەڵک، قەت نەمگۆتیتە کەس پەرداخە ئاوێکیشم بدەنیٚ، قەت ڕۆژێك قبوڵم نەکردوە کەس یارمەتیەکم بدات، لە ژن و منداڵم لیٚ دەرچێت، یانی فێر

نەبووم باری خۆم بخەمە سەر شانی کەس. کەچی ئێستا وا پەکم بکەوێت نەتوانم بنە خۆشم خاوێن کەمەوە؟!

جارێ وردە وردە دەورم چۆڵ بوو، ژنم مرد و دوو کوڕم هەبوو چونەتە خاریج، هەر خەبەریان بڕا! و کچێکم هەبوو خەریکی ماڵ ومنداڵیەتی، مێردەکەی خراپە، بەوی بی شەیتانی ببینی قەت ئەمنی نەبینی! کچەکەشم لە بنەڕەتدا بێ شعورە، مێردی بێ شعورتری کردیە! دەڵێم با ژیانیان لێ تێک نەچێت، هەتا گلەیشم لە کچ و کوڕەکانیشم نەکردیە، چونکە پشتم هەر بەتۆ قایم بووە خودایە، هەموو دوعام ئەوە بوو، خودایە من لەبەر تۆ وا فێری بێ نیازی بووم لە خەڵک، و وا عیزەتی نەفسم بەهێزە، توخواکەی موحتاجی دەستی کەسم نەکەیت، و ئامەنەتی خۆتم لێ وەرگرەوە! بەسە ئەو تەمەنە درێژە بەو بێ ناز و بێ کەسیەی!

ئەخر کوو گلەیی نەکەم، ئەوە پێم ناوەتە ناو ٩٠، لە پاداشتی ئەو هەموو ژیانەم لە عیبادەت و نوێژ و ڕۆژی و قورئان خوێندن و چاکە کردن، عەقڵم وا تێک بچی منداڵ و توال پێم پێبکەنن و گاڵتەم پێ بکەن! ئەوەش قەیدیناکا بگاتە ئەو حالەتەی لە پێ بکەوم، ئەوەش هەر قەیناکا بگاتە ئەو حەدەی گووش لەبنە خۆم بکەم! ئەخر ٩٠ ساڵ خزمەتی ئاغای گوندیم کردبا، لەپاش مردنی دەمیکردە ئاغا یان سەرۆکی کێخوایان لە جێی خۆی، تا مردن چاکەی لەگەڵ دەکردمەوە!

- حاجی مستەفا زۆر ڕۆیشتی نازانیت ئەو قسانە کوفرە کوفر هەی خەڵەفاو؟! وادەزانی خوا منەتی بە عیبادەتی تۆیە؟!

- کورە دەزانم منەتی بە عیبادەتی کەس نییە، بەس نازی خۆشەویستیە لەسەری دەکەم، زۆر شوکرم بەس بەخوای کە لەبنە خۆم دەکەم لە ماڵی ئەو پیاوە باشە ناسیارەی، کە پێموابێ وەک من گێلە، گەلەك شەرم لە خۆم دەکەمەوە، ژنەکەی و منداڵەکانی هەزار قسەی ناخۆشم بە گوێ دادەدەن، وادەزانن خەڵەفاوم هیچ تێ ناگەم، ئەمنیش لە شەرمان خۆم زیاتر لە گێلی دەدەم! ئەخر کوو گلەییت لێ نەکەم خوایە پاش ٩٠ ساڵ وا ببمە سینەمای خەڵك و وا کەرامەتم بشکێت لەبەرچاوی غەریبان! ئای چەند تاڵ بوو خودایە کە کوڕ و کچەکانی لەگەڵ دایکیان بوونە یەك گۆتیان: یان حاجی مستەفای دەردەکەیە دەرەوە یانیش ئێمە بۆتی بەجێ دەهێڵین! دەی بەو سەرمایەی لە بن ئەو دیوارەی فڕێ درایمە و پڕی بنە خۆم کردیە، دە مەلایکەتێك یان حۆریەکم لۆ بنێرە پاکم کاتەوە، هەزار حۆری و مەلەیکەتم لۆ چیە لە بەهەشت، خۆزگە لە دنیا کەرامەتم وا نەدەشکا! خۆزگە بەس خۆم پیس نەکردبا تا دەمردم، ئەوجا دەمگووت ٩٠ ساڵی عیبادەتمت حەڵاڵ بێت...ئەستەغفیروڵڵا خودایە لە

عەبدێکی خەڵەفاوی کەم عەقڵی تڕکەن و گوو لەبن خۆکەر نەگریت!

محەمەد هەریری

٢٠١٦/١٠/١١

# بابە ناوێرم بە تەنیا بچم میز بکەم!

- ئەخر ئەی هاوار چۆن کچم بکوژم لەسەر قسە وقسەڵۆکێك، کە کەس نازانێت ڕاستە یان درۆ؟!

- باشە دووکەڵ بێ ئاگر دەبیت؟!

- بەڵێ ئێستا دنیا هێندە پێشکەوتووە، بۆمبی دووکەڵی بەبی ئاگر ڕۆژانە لە هەواڵەکان دەبینین! ئەوە بەس کوردە هێشتا وادەزانێت دووکەڵ بێ ئاگر نابێت!
کوشتنیش شتەکی هەوەنتە و بچووک نییە بەو پەندە قۆڕانە شەرعیەتی پێ بدەین، ئەوە جەرگی منە، من تەنها ئەو کچەم هەیە لەناو پێنج کوڕاندا!

- دەك عەمرت نەمینێ بەخوا پیاوێکی ژنانی و عاتیفی، کە شەڕەف هاتە گۆڕێ خەڵک چۆن باسی جەرگ و مەرگ دەکات؟! کورە سندانی لێدا ئەو جەرگە! وەک کوێخا عوسمانی بە، سێ مەخزن گوللەی لە کچە بێ شەڕەفەکەی بەتاڵ کرد، یەك دڵۆپە فرمێسکیشی نەڕژت!

ئەها گوێبگرە زوبێر بەخوای ئەو بێ شەڕەفیەی قبوڵ بکەی، نە براتم نە دەتناسم، لە لای هەموو خەڵکیش دەڵێم حاشامان لێکردوە، هیچی مە نییە، یەک کەسیش لە قەوم وقیلەت قسەت لەگەڵ ناکات!

- ئەخر عوزێر ئەتووەکی ڕۆشنبیر و شوعی بێ دین، لە

